بسم الله الرحمن الرحيم

# نەمانی شەریعەت؛ چەند ڕەهەندێکی دەروونی

نووسینی شیخ؛ رفاعي سرور – ڕەحمەتی خوای لێبێ

## خۆشویستنی وەحی وسرووش

**پرسی چەسپاندنی شەریعەت لە لای مرۆڤی موسوڵماندا پرسی بڕواو تەسلیم بوونە، کە مانای وتەی خوای پەروەردگارە کە دەفەرموێت:** (فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيماً) (النساء:65) – نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەك دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووە و دەبێت بەتەواویی تەسلیم بن و ڕازیی بن.

**ژێرخانی تەسلیم بوون وبڕواش بە پرسی حاکمیەت خۆشویستنی وەحییە، بەو پێوەرەی کە هەست کردن بەم حوکمە، لەو خۆشەوسیتییەوە سەرچاوە دەگرێت.**

**ئەنەس - ڕەزای خوای لێبێ - دەگێڕێتەوە دەفەرموێ:** "دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ئەبو بەکر بە عومەری فەرموو - ڕەزای خوایان لێبێ - : هەستە بچینە لای أم أيمن وسەردانێکی بکەین، وەك چۆن پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - سەردانی دەکرد، کاتێك کە گەیشتنە لای، گریا، فەرموویان: بۆ دەگری ؟ مەگەر نازانی ئەوەی لای خوای پەروەردگارە خێر وچاکترە بۆ پێغەمبەر خوا - صلى الله عليه وسلم -، فەرمووی: بۆ ئەوە ناگریم وەك کە نەزانم ئەوەی لای خوای پەروەردگارە بۆ پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - خێر وچاکترە، بەڵام بۆ

ئەوە ئەگریم کە ئیتر وەحی لە ئاسمانەوە دابڕا، جا هانی لەسەر گریان دان وئەوانیش لەگەڵیا دەستیان کرد بە گریان ".

**جوانییش قووڵترین ڕەهەندی خۆشەویستییە .. بۆیە خۆشەویستی وەحی هەست کردنە بە جوانی ئەو وەحییەوە، هەر وەك چۆن پەڕەی قورئان پێوەری ڕەهای جوانی بووە لە لای مرۆڤی موسوڵماندا:**

**ئەنەسی کوڕی مالیك - ڕەزای خوای لێبێ - دەگێڕێتەوە:** (أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَانَ يُصَلِّي لَهُمْ فِي وَجَعِ رَسُولِ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ الاِثْنَيْنِ — وَهُمْ صُفُوفٌ فِي الصَّلاَةِ — كَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– سِتْرَ الْحُجْرَةِ فَنَظَرَ إِلَيْنَا، وَهُوَ قَائِمٌ كَأَنَّ وَجْهَهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ. ثُمَّ تَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– ضَاحِكًا...) - لەو نەخۆشییەی پێغەمبەر تێیدا کۆچی دوایی کرد - صلى الله عليه وسلم - ئەبو بەکر بەرنوێژی خەڵکی دەکرد، تا ئەو کاتەی ڕۆژی دووشەم بوو وخەڵك بە ڕیز لە نوێژدا وەستابوون، پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - پەردەی ژوورەکەی لاداو بە پێوە سەیری کردین، ڕوومەتی وەك پەڕە قورئانێك وا بوو. پاشان پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بە دەم پێکەنینەوە زەردەخەنەیەکی کرد ...".

**ئیمامی نەوەوی - ڕەحمەتی خوای لێبێ - دەفەرموێ:** " (كَأَنَّ وَجْهَهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ - ڕوومەتی وەك پەڕە قورئانێك وا بوو) دەربڕینی جوانی وقەشەنگی پێست وڕووناکیی وڕوومەت سافییە"، **ئیمامی سیندی لەسەر ئەو قسەی دەدوێت ودەفەرموێ:** "قورئان وموسحەفیش بریتییە لەوەی باسی دەکات - واتا ئیمامی نەوەوی - و بە زیادەی ئەوەی خۆی - ئەو قورئانە - لە دڵ ودەروونددا خۆشەویست وگەورەیە، ئەگینا بە تایبەت باس کردنی قورئان نسبەت بەو پەڕەوە مانایەکی نەدەبوو، بۆیە ئەوە جێگەی تێڕامانە".

**پاشان دەفەرموێ: "کە دەفەرموێ:** (ثُمَّ تَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– ضَاحِكًا - پاشان پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بە دەم پێکەنینەوە زەردەخەنەیەکی کرد) هۆکاری خەندەی پێغەمبەر

- صلى الله عليه وسلم - دڵخۆشبوونی بە کۆبوونەوەیان بوو لە نوێژ وشوێنکەوتنی ئیمامەکەیان وبەجێگەیاندنی شەریعەتەکەی ویەك وتەیی ویەك دڵییان بوو، بۆیەش پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ڕوومەتی ڕووناك بووەوە، هەر وەك چۆن عادەتی وا بوو کە هەواڵێکی خۆشی بیستبا یا شتێکی دیبا بە دڵی بوایە وپێی خۆش بووا دەموچاوی نوورانی ئەبوو".

**هەر وەك چۆن وەحی وسرووشیش خۆشەویست بوو گوێڕایەلی کردنیش هەر وا خۆشەویست بوو، ڕەفتاری هاوەڵانیش دەرحەق بە پرسی گوێڕایەلی ئەم ئەسڵە ڕوون دەکەنەوە، عەوفی کوڕی مالیك - ڕەزای خوای لێبێ - دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:** (أتيت رسول الله صلى الله عليه وسلم وهو في بناء له، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ. فَقَالَ: عَوْف؟ قُلْتُ: نَعَم يا رَسُولَ الله ! قال: ادخُل. فَقُلْتُ: كُلِّي أَمْ بَعْضِي. قال: بَل كُلُّك. قال: فقال لي: اعْدُدْ عَوْف ! سِتًّا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ؛ أَوَّلُهُن: مَوْتِي. قال: فَاسْتَبْكَيْتُ حتى جَعَلَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم يسكتني....) - چوومە لای پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - کە لە خانوویەکی دابوو، سڵاوم لێی کرد، فەرمووی: ئەوە عەوفە ؟ گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی: بێرە ژوورەوە. گوتم: تەواو بێمە ژوورەوە یا هەر بەشێکم بێنمە ژوورەوە، فەرمووی: نا تەواو وەرە ژوورەوە. عەوف ئەفەرموێت: پێمی فەرموو: عەوف؛ شەش دانە شت بژمێرە لە بەردەمی قیامەتدا ڕوو بدەن؛ یەکەمیان: مردنمە .. ئەفەرموێ: خۆم دایە گریان تا پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - کەوتە بێدەنگ کردنم ...).

**ئا لێرەوە جوانی گوێڕایەلی هاوشان وهاوەڵی جوانی وەحی وسرووشە، ابن القيم لە ڕاڤەی فەرموودەی:** (إِنَّ اللهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الجَمال - خوای پەروەردگار جوانەو حەز بە جوانی دەکات) **دەفەرموێ: "ئەو جوانییەی جێگەی ستایشە جوانییەکە بۆ خوای پەروەردگار بێتو یارمەتیدەری گوێڕایەلی خوای پەروەردگار وبەجێ گەیاندنی ئەمر وفەرمایشتەکانی وبە دەمەوە چوونی بێت، وەك چۆن پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - خۆی بۆ شاندەکان جوان دەکرد، هەروەك لەبەرکردنی کەرەستەی جەنگیش لە کاتی شەڕداو، لەبەرکردنی حەریر لە جەنگداو بە عیزەت وفەخرەوە مرۆڤ لە مەیدانی جەنگدا ڕێ بکات، چونکە هەر کاتێك کە**

بەرز ڕاگرتنی وتەی خوای پەروەردگار وسەرخستنی دینەکەی ورقی دوژمنەکەی تیا بوو ئەوە جێگەی ستایشە ..

ئەوەی مەزمووم ونابەجێشە کە بۆ دونیا وریاسەت وفەخر ولووتبەرزی وگەیشتن بە شەهوەت وئارەزوو بێتو، ببێتە مەبەست وئەوپەڕی داوای بەندەیەك، چونکە زۆرێك دڵ ودەروون هەن هیچ ویست وخواستێکیان جگە لەو شتانەوە نییە. ئەوەی کە نە جێگەی ستایش ونە جێگەی زەمیش بێت ئەوەیە کە ئەم دوو مەبەست وقەسدەی تیا نەبێ ..

مەبەستیش ئەوەیە کە ئەم فەرمووده بەڕێزە دوو ئەسڵی گرنگی لە خۆ گرتووە :- یەکەمیان زانین ودووەمینیان ڕەفتارە. مرۆڤ بەو جوانییەوە خوای پەروەردگار بناسێت کە هیچ هاوتا وهاوشێوەیەکی نییەو، بەو جوانییەی خوای پەروەردگار خۆشی لێ دێ بیپەرستێت؛ چ لە قسەو گوفتار وچ لە کردار وڕەوشت وڕەفتاردا بێ. بۆیە خوای پەروەردگار حەزدەکا بەندەکەی زوبانی خۆی بە ڕاستگۆیی جوانکاتو، ودڵ ودەروونی بە ئیخلاص وخۆشەویستی - واتا خۆشەویستی خوای پەروەردگار - وگەڕانەوە بۆ لای خواو پشت بەستن وتەوەکول بە خوای گەورە جوانکات، وئەندامەکانی بە گوێڕایەلی وفەرمانداری، وجەستەی بە دەرخستنی نیعمەتی خوای پەروەردگار لە جل وبەرگ ولیباسیداو پاك کردنەوەی لە پیسی وچەپەڵی ومووی مەکروهـ وخەتەنە وگرتنی نینۆکەکانی جوانکات ...

بە سیفەتەکانی جوانییەوە بیناسێت، وبە کردار وگوفتار وڕەفتارە جوانەکانەوە خۆی پێ بناسێنێ ..
بەو جوانییەوە بیناسێت کە وەسفی خۆیەتیو، بەو جوانییەوە بیپەرستێ کە شەرع ودینەکەیەتی". [قسەکانی ابنُ القَیِّم کۆتاییان هات].

# خۆشویستنی حاکمیەت

**لە خۆشویستنی گوێڕایەلییەوە دەگەین بە خۆشویتنی حاکمیەت، چونکە حیکمەتی دابەزینی قورئان حوکمەکەیەتی، بۆیە ابن القیم لە تەفسیری وتەی خوای پەروەردگاردا:** (وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُوراً) – پیغەمبەر صلى الله عليه وسلم سکاڵا دەکات و دەفەرموێت: پەروەردگارا بەڕاستی قەومەکەم وازیان لەم قورئانە هێناوە و پشت گوێیان خستووە و گرنگی پێ نادەن (الفرقان:30) ، **دەفەرمێ؛** "پشت کردنە قورئان چەند جۆرێکە:

یەکەمیان: پشت لە گوێگرتن وبڕوا پێ هێنانی. ودووەم: پشت کردنە ئەنجامدانی وکار پێکردنی ئەگەرچی بشیخوێنێتەوەو بڕوای پێ بێت. سێیەمیان: پشت کردنە داوەری کردن وحوکم بۆ بردنەوەیەتی. وچوارەمیان: پشت کردنە تێڕامان وتێگەیشتنی ماناکانییەتی. وپێنجەم: پشت لە بەکارهێنانیەتی بۆ دەواو شیفای تەواوی دەردەکانی دڵ ودەروون. هەموو ئەوانەش دەچنەوە ژێر ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: (إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُوراً) – بەڕاستی قەومەکەم وازیان لەم قورئانە هێناوە و پشت گوێیان خستووە و گرنگی پێ نادەن –، ئەگەرچی بڕە پشت کردنێك لە بڕێکی دی سووکترە".

**ئا لێرەوە خۆشەویستی قورئان خۆشویستنی حوکم کردنە بەو قورئانە:**

**أبو هريرة وزەیدی کوڕی خالید - ڕەزای خوایان لێبێ - دەگێڕنەوە دەفەرموون کە لای پێغەمبەر بوون - صلى الله عليه وسلم - پیاوێکی هاتە لا، وتی:** "أَنْشُدُكَ اللَّهَ إِلا قَضَيْتَ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَقَالَ خَصْمُهُ وَكَانَ أَفْقَهْ مِنْهُ: اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ وَأْذَنْ لِي فِي أَنْ أَتَكَلَّمَ. قَالَ: تَكَلَّمْ. قَالَ: فَإِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا ، وَإِنَّهُ زَنَى بِامْرَأَتِهِ فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِئَةِ شَاةٍ وَخَادِمٍ، وَسَأَلْتُ رِجَالا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ فَأُخْبِرْتُ أَنَّ عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ، وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَعَلَى امْرَأَتِهِ الرَّجْمُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ ، أَمَّا الْمِائَةُ الشَّاةُ وَالْخَادِمُ رَدٌّ عَلَيْكَ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ، وَتَغْرِيبٌ، وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا"

– وتی: بۆ خاتری خوا بە کتێبەکەی خوا داوەریمان لە نێواندا بکە، بەرامبەرەکەی لەو تێگەیشتووتر بوو وگوتی: بە کتێبی خوای پەروەردگار داوەریمان لە نێواندا بکەو مۆڵەتمدە قسە بکەم. فەرمووی: قسە بکە. فەرمووی: کوڕەکەم لای ئەم پیاوە کارگەر وخزمەتکار بوو، وزینای لەگەڵ خێزانی ئەم پیاوەدا کرد، منیش سەد بەران وخزمەتکارێکم پێی دا وەك فیدایەك بەرامبەر بە کوڕەکەم، پرسیارم لە کۆمەڵێك ئەهلی زانست کرد پێیان گوتم؛ کوڕەکەت سەد جەلدەو ساڵێك دوورخستنەوەی لەسەرەو، ئافرەتەکەی ئەمەش رەجم وبەردباران کردن. پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: قەسەم بەوەی نەفسی منی لەدەست دایە، بە کتێبی خوای پەروەردگار داوەریتان لە نێواندا دەکەم، هەرچی ئەو سەد بەران وخزمەتکارەی پێت دا وەری ئەگریتەوەو، کوڕەکەت سەد جەلدەو دوورخستنەوەی لەسەرە، وتۆش ئەی "أُنَيْس" بچۆ لای خێزانی ئەمە، گەر دانی بە تاوانەکەی نا رەجمی بکە".

**شتێك لێرەدا جێگەی تێڕامان بێ کە هەردوو لا دێنە لای پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - وداوای لێ دەکەن بە کتێبی خوای پەروەردگار داوەریان لە نێواندا بکات، ئەم هەڵوێستەش دەلالەتە لەسەر سروشتی ڕفتار کردنی دەروونی لەگەڵ پرسی حوکم کردن بە کتێبی خوای پەروەردگار، کە هەر دوو خێزان وباوك دێنە لای پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بە ئەگەری رەجم کردنی ئافرەت وکوڕەکەوە.**

**هەروەها دەبینین کە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - فیدای بەرانەکان وخزمەتکارەکە پێش ئەوەی حوکمیان لە نێواندا بە کتێبی خوای پەروەردگار بکات دەگەڕێنێتەوە، کە بنەمایەکە مانای ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئیسلام قبووڵکردنی شەرعی خوا وڕەتدانەوەی هەرچی شتێکی ترە، بۆیە پێویست بوو بەر لەوەی حوکم بە شەرعی خوای پەروەردگار بکرێت هەرچی شتێکی غەیری شەرعی خوایە ڕەتدرێتەوە.**

**ئەو نموونانەش کە خاوەنەکانیان ئەهاتنە لای پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - وداوای جێبەجێکردنی حەدی رەجم کردنیان دەکرد لە هەمان ئەم چوارچێوەدایە، وەك ماعیز**

وئافرەتە غامیدییەکە، کە زۆر بە پەرۆشییەوە داوای ئەوەیان دەکرد حەدیان لەسەر جێبەجێ بکرێت ..

هەڵوێستەکە هەڵوێستێکی کاردنەوەیی‌و بە حەماسەت نەبوو .. مەسەلە مەسەلەی رەجم کردنە ..

هەڵوێستێکی هەروا نەبوو .. چونکە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - چەند جار بەسەریان دا هاتەوەو پرسیاری لێکردنەوە کەچی ئەوان سوورِ بوون. بەڵکو هەر جارێك هۆکارێکی بۆ ئافرەتەکە دەدۆزییەوە چەند مانگێك پێی دوورکەوێتەوە .. تا منداڵەکەی دادەنێت .. تا شیری دەدات .. تا لە شیری دەبڕێتەوە .. بەڵام لە کۆتادا خۆی وبە کەرتێك نان لە دەمی منداڵەکەیدا دێتەوە لای پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - .. !!

کۆمەڵێك هەڵوێستن ناکرێت هەست کردنی موسوڵمان بە چەسپاندنی شەریعەتەوە لێیان دوور بێت ..

بەڵام پرسەکە لە لای هەست کردنەوە ناوەستێت، بەڵکو تەواوی بوونی خاوەنی ئەو هەستە دادەگرێت، لە رێی کۆك بوونی شەریعەتی ئیسلامی وسروشتی مرۆڤانەوە.

لە ئایەتی (ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ) – ئەوەیە دینی ڕاست و دروست – دا لە ڕاستی ئەم کۆك بوونە حاڵی دەبین، کە وەك زاراوە تەنها لە سێ شوێنی قورئاندا هاتووە:

- (فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ) - ڕوو بکەرە بەرنامەو ئاینی خواو ئەملاولا مەکە، خەڵکینە ئێوەش پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە (واتە قورئان کەتەلۆك و نەخشەی ژیانی

ئادەمیزادەکانە لێی لامەدەن)، هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە هیچ نەخشەو دروستکراوێکی خوادا نی یە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە نازانن (الروم:30).

ـ (مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ) جا هەرچی ئێوە دەیپەرستن جگە لە خوا، تەنها خۆتان و باو و باپیرانتان ناوتان لێناون (تەنها ناون و ناوەڕۆکیان نی یە)، هەرگیز خوا بەوە ڕازی نی یە و، هیچ بەڵگەیەکیشی ڕەوانە نەکردووە لەسەر پەسەند کردنیان، بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی جگە لە خوا شایستەی کەسی تر نی یە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن، هەر ئەوەش ئایین و بەرنامەی پەسەند و ڕاست و دروست و بەنرخ، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە نازانن و لێی بێ ئاگان (یوسف:40).

ــ (إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِنْدَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْراً فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنْفُسَكُمْ وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) – بێگومان ژمارەی مانگەکان لای خوا دوانزە مانگە، لەکتێبی خوادا لە (لوح المحفوظ) دا دیاریکراوە، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، چوار مانگی بە حەرام داناوە[1]، هەر ئەوەیە ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروست، کەوابوو لەو مانگانەدا ستەم لە خۆتان مەکەن، وە دژی موشریکان هەمووتان بجەنگن بە گشتی هەروەکو ئەوان دژی ئێوە دەجەنگن بەگشتی، ئینجا بشزانن کە خوا یارو یاوەری ئەو کەسانەیە کە لێی دەترسن و پارێزکارن (التوبة:36).

[1] شیخ عبدالرحمن بن ناصر السعدی لە تەفسیرەکەیدا ل ٣٣٦ دەفەرمێ: (... بە "حەرام" ناویان نراوە، وەك زیادە حورمەت وگەورەییەکی ئەم مانگانەو، بۆ قەدەغەکردن وحەرام کردنی جەنگ وشەڕ کردن لەم مانگانەدا ... هەروەك زوڵم وتاوان کردن لەم مانگانەدا لە کاتی تر گەورەترە. هەروەها قەدەغەکردنی شەڕ کردن لەسەر قسەی ئەو کەسانەی کە پێیان وایە حوکمی حەرام کردنی شەڕ لە مانگە حەرامەکاندا نەسخ نەکراوەو ماوەتەوە، وەك بەکاربردنی ئەو دەقە گشتیانەی شەڕیان تێدا حەرام دەکەن).
ابن مفلح رحمە اللە لە کتێبی [الفروع ١٠/٤٧] دا دەفەرمێ: (شەڕ کردنیش لە حاڵەتی بەرگری کردندا بە یەك دەنگی زانایان لە مانگی حەرامدا جائیزەو ڕێگەی پێ دراوە). – [وردەکاری زیاتر لە کتێبەکانی تەفسیردا هەیە]. https://islamqa.info/ar/227931.

**لە هەر سێ شوێنیشدا مانای فیترەت وسروشتی مرۆڤ:** (فِطْرَتَ اللَّهِ فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ) - ئەو نەخشەیەی کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە ، هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە هیچ نەخشەو دروستکراوێکی خوادا نی یە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست و دروست – **لەگەڵ سروشتی حوکمڕانی:** (إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ) - بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی جگە لە خوا شایستەی کەسی تر نی یە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن، هەر ئەوەش ئایین و بەرنامەی پەسەند و ڕاست و دروست و بەنرخ – **ولەگەڵ سروشتی گەردوون وسیستمی گەردوونیدا یەکدەگرنەوە** (يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ) – هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، چوار مانگی بە حەرام داناوە، هەر ئەوەیە ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروست.

**ئەهلی تەفسیریش تێکڕا لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا** (فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ) (الروم:30) **یەکراِن کە مانای فیترەت وسروشتی مرۆڤانە لەگەڵ شەریعەتدا یەك دەگرێتەوە. ئیمامی ابن کثیر - ڕەحمەتی خوای لێبێ - دەفەرمێ:** (خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ڕێی دروست بگرەو لەسەر ئەو شەرعەی خوای پەروەردگار بۆی داناویت بەردەوام بە، کە حەنیفیەتی میللەتی ئیبراهیمەو، خوای پەروەردگار بەرەو ئەوی ڕێنموونی کردوویتو، وتەواو بۆی کامڵ کردوویت. لەگەڵ ئەوەش سروشتی دروستی خۆت بەدەستەوە بگرە، کە خوای پەروەردگار دروستکراوەکانی خۆی لەسەر بەدی هێناوە، چونکە خوای تعالی دروستکراوەکانی لەسەر ناسینی خۆی وبە تەنها پەرستنی ئەو هێناوەتە دی وسروشتی داڕشتوون، کە هیچ خودایەك جگە لەو بوونی نییە، وەك چۆن لە پێشتردا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى} - کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە و (پێی فەرموون): ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو وتیان: نابێت تۆ خوای ئێمە نەبیت - [الأعراف: 172]،

هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە: "إِنِي خَلَقْتُ عبادي حُنَفاءَ[2]، فاجْتَالَتْهُمُ الشَيَاطِينُ عَنْ دينِهِم" — من بەندەکانم ڕاست ودروست وبە موسوڵمانی دروست کردووە ، ئینجا شەیتانەکان هاتن ولە دینەکەیان دووریان خستنەوە -).

**ئیمامی قُرطُبِي ئەم وتانە کۆدەکاتەوەو دەفەرموێت:** "ماناکە ئەوەیە کە؛ خوای پەروەردگار وەك سروشتێك خەڵکی لەسەر ئەو فیترەتە بەدی هێناوە. هەروەها وتراوە: مانای ئەوەیە شوێن ئەو دینەی خوای پەروەردگار بکەون کە مەردمی بۆ بەدی هێناوە .. فیترەتیش بە دین ناونراوە، چونکە خەڵك بۆ ئەو دین وفیترەتە بەدی دێنرێن، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالأِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ}- یگومان من پەری و ئادەمیزاد م هەر بۆ ئەوە دروست کردووە کە من بپەرستن".

{لا تبديل لخلق الله} – هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە هیچ نەخشەو دروستکراوێکی خوادا نی یە **:- واتا کار لەسەر گۆڕینی ئەو ئامادەبوون وتوانای وەرگرتنی بڕواو تەوحید ویەك خوا پەرستییە مەکەن، بەڵکو ئەم شەریعەتە بپارێزن، بەوەی لەیەك چووەکانی لێك جیا بکەنەوەو، حاڵ وئەحواڵی مرۆڤەکان بناسنو، ڕۆژگارێك لە شەریعەتدا بڕوانن،و لە مەرام ومەبەستەکانی حاڵی بن،و بە ویستی حەقەوە خۆیان لەوە بپارێزن لەگەڵ هەواو ئارەزووەکاندا بەملاولا بچن ..**

2 **[حُنَفَاء]** کۆی وشەی **[حَنِيف]**ە، بە مانای ئەو کەسەی کە مەیلی بەرەو ئیسلامەو لەسەری جێگیرە، واتا ئامادەباشی حەق وگوێڕایەلییان هەیە، وەك ئاماژەیەك بە فیترەت، واتا موسوڵمان. هەروەها دەوترێ ماناکە ئەوەیە کە پاکن لە گوناە وتاوان، یا ئەوەتا گوێڕایەل وئامادەی وەرگرتنی هیدایەت وڕێنموونی. هەروەها دەوترێ ماناکەی ئەوەیە کاتێك کە عەهد وپەیمانی لێ وەرگرتن **{**أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى**}** — ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم ؟ وتیان؛ بەڵێ وایە. هەر کام لەم مانایانەش جێی تێیە کە مەبەست بن. (لە سایتی "مجلس الألوكة"وە).

**کە خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت:** {ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ} – ئەمە دین وئاینی ڕاست ودروستە - **: واتا دەست گرتن بە شەریعەتو سروشت وفیترەتی دروست، کە بریتییە لەو بەدی هێنانەی خوای پەروەردگار خەڵکی لەسەر دروست کردووە، کە؛ ئیسلامە.**

**لە فەرهەنگدا هاتووە:** "القَيّم: السيّدُ وَ سائِسُ الأَمر .. وَ قَيّمُ القَوْم: الذي يَقومُ بِشأْنِهِم وَ يَسُوسُ أَمْرَهُم، و أَمْرٌ قَيّم: مُسْتَقيم" **- القَيّم: واتا گەورەو کار بەدەست وبەڕێوەبەر ..** قَيّمُ القَوْم: **ئەو کەسەی بە کار وباریان هەڵدەستێتو ئیشیان بەڕێوە دەبات .. هەروەها** أَمْرٌ قَيّم: **واتا کارێکی ڕاست ودروست.**

**بەم شێوەیە مانای** "قَيّم" **لە لایەنی مرۆڤەوە: لەگەڵ دروستکردنی مرۆڤەوە یەکدەکاتەوە بە پێی پێداویستییەکانی شەریعەت.**
**لە لایەنی شەریعەتیشەوە: سیاسەت وبەڕێوە بردنی کاروباری مرۆڤە بە پێی فیترەت وسروشتییەوە.**

**بە کۆك بوونی سروشتی مرۆڤانەو شەریعەتیش، دەقە قورئانییەکان بە مەودایەکی گەردوونیدا دەڕۆنو دووپاتی کۆك بوونی سروشتی گەردوونی وحاکمیەت دەکەنەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** (إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِنْدَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْراً فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنْفُسَكُمْ وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) بێگومان ژمارەی مانگەکان لای خوا دوانزە مانگە، لەکتێبی خوادا لە (لوح المحفوظ) دا دیاریکراوە، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، چوار مانگی بە حەرام داناوە ،هەر ئەوەیە ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروست، کەوابوو لەو مانگانەدا ستەم لە خۆتان مەکەن و جەنگ بەرپا مەکەن، دژی موشریکان هەمووتان بجەنگن بە گشتی هەروەکو ئەوان دژی ئێوە دەجەنگن بەگشتی، ئینجا بشزانن کە خوا یارو یاوەری ئەو کەسانەیە کە لێی دەترسن و پارێزکارن (التوبة:36)

**تا ئەوەی کە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە فەتح وئازادکردنی مەکەو چەسپاندنی شەرعی خوای پەروەردگار لە مەکەدا کۆنترۆلکردن وزەبت کردنی تەواوی بزاڤی گەردوونی بوو. أبو بکرة لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە - ڕەزای خوای لێبێ - کە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - دەفەرموێت:** "إِنَّ الزَّمَانَ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ تَعَالَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا، مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاثَةٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدَةِ، وَذُو الْحِجَّةِ، وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبُ شَهْرُ مُضَرَ الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ، وَقَالَ: أَيُّ شَهْرٍ هَذَا ؟ قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ قَالَ: أَلَيْسَ الشَّهْرَ الْحَرَامَ ؟ قُلْنَا : بَلَى.." – ڕۆژگار وەك ئەو ڕۆژەی لێهاتۆتەوە کە خوای پەروەردگار ئاسمانەکان وزەمینی تیا دروست کردبوو، ساڵ دوازدە مانگەو، چواریان مانگی حەرامن سێیان بە دوای یەکەوەن: ذو القِعدَة، و ذو الحِجَّة، و مُحَرَّم، و رَجَب کە مانگی "مُضَر"ە لە نێوانی جُمادَی و شَعْبان، دواتر فەرمووی: ئەمە چ مانگێکە ؟ وتمان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر ئەزانن، فەرمووی: مەگەر مانگی حەرام نییە ؟! وتمان: بەڵێ وایە ..

**لە وەڵامی پرسیارەکەی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - دەربارەی مانگ وخاکی حەرامەوە لە لایەن هاوەڵان کە (**اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَم - خواو پێغەمبەرەکەی باشتر ئەزانن**) مانای تەفویز وخۆبەدەستەوەدانی تەواو بۆ حوکمی خوای پەروەردگار لە کات وشوێندا دەبینین، بەمەش مانای** "الدین القیم" **سروشتی دەروون وشەریعەت ویاسای حوکمڕانی وسیستمی گەردوون دەگرێتەوە ..**

**لە بەرامبەر ئەم ڕێککەوتن وکۆك بوونەشدا، ونبوونی شەریعەت گەورەترین کێشەی دەروونی وسیاسی وگەردوونی دەخاتە ڕوو ..**

**ئەو کێشەو خەلەلەی دەگاتە ئاستی شێواندن وڕوخسار گۆڕین [**مَسْخ**]ی ڕاستەقینەوە ..**

بۆیە کاتێك کە جوولەکە لە ڕێگەی یەك گوناهەوە فێڵیان لە شەرعی خوای پەروەردگار کرد، کە ڕاوکردنی ڕۆژی شەممە بوو، خوای پەروەردگار کردنییە مەیموون وبەراز ..

لەگەڵ ئەوەی کە دەرچوونیان بە ڕووی ئەو حوکمە یاخود ڕەت کردنەوەی ئەو حوکمەیان ڕانەگەیاندبوو، بەڵکو فێڵیان لەو حوکمە کرد وەدەوریان لێیدا. بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەوان ماسییەکانیان هەر لە ئاودا جێدەهێڵا بۆ ئەوەی لە خودی ڕۆژی شەممەدا (فەرمانیان پێ کرابوو حورمەتی ڕاگرن وڕاوی تیا نەکەن) دەری نەهێنن ..

کەواتە لەکارخستنی شەریعەت وگۆڕین وگاڵتەو سووکایەتی پێکردن ودژایەتی ئەو کەسانەی بانگەواز بۆ چەسپاندنی شەریعەت دەکەن .. دەبێ حاڵی ئەوە چی بێ ! بێ گومان هەر شێواندن وڕوخسار گۆڕینە ! بەڵام نەك لە دیمەن وڕووکەشدا، بەڵکو لە سروشت وڕەفتارەکان .. بۆ ئەوەی تەواوی ئەو کەسانەی کە بەرهەڵستی شەرعی خوای پەروەردگار دەکەن وێنەیەکی مرۆڤانەی شێواو وگۆڕێنراو بن، بە سووکی مەیموونەوە لە دژایەتی شەریعەت دا بسووڕێن وبخولێنەوە، وبە سروشتی بەرازەوە پشتیان لە خاوێنی بێتو وڕوو لە پیسیدا، کەسانێك کە لە ژێر ناونیشانی دوو ڕوویدا ژیان دەکەن.

(أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا . وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا) ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو کەسانەی لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانەکراوە (بۆ پێغەمبەران)! کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە (تاغوت) نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بەگومڕاییەکی دوورو بێ سنوور - کاتێکیش پێیان بوترێ: وەرن بۆ لای ئەو (قورئانەی) کە خوا ناردوویەتی یە خوارەوە و بۆ لای پێغەمبەرەکەی (بۆ چارەسەری کێشەکانتان) کەچی دەبینی دووڕووەکان پشتت تێدەکەن و ڕووت لێ وەردەگێڕن بەتەواوی [النساء: 60-61]

**ئیمامی سعْدي لە تەفسیردا دەفەرمێ: "خوای پەروەردگار کە لۆمەی پشت کردنیان لە حوکم وبڕیاری شەرعییەوە دەکات دەفەرموێت:** (أَفِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ) – ئایا دڵیان نەخۆشی تیایە ؟! – "واتا: دەرد وعیلەتێك، ئەم دڵەی لە حاڵەتی تەندروستی خۆی دەرهێناوەو هەستی لەدەست داوە، بۆیە لە پێگەی نەخۆشدایە، پشت دەکاتە هەر شتێك سوود ونەفعی خۆی تیا بێت وڕووی لە زەرەر وزیانی خۆیەتی".

**ونبوونی هەست کردن بە ڕاستیش لە ناکاو ڕووی نەداوە، بەڵکو بە تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا بەدی هاتووە، تا لە ئاخیری زەمان وکۆتایی ڕۆژگاردا بەوپەڕی خۆیەوە دەگات، کە خەڵك:** (شَرٌّ من الحُمُر يَتَسَافَدُون كما تَتَسَافَد البهائم، وليس فيهم رَجُلٌ يقول مَهْ مَهْ) **واتا هیچ کەسیان نییە تەنانەت پرسیارێکیش بکات وا چ دەگوزەرێ .. !**

**گەیشتنی خەڵکیش لە کۆتایی ڕۆژگاردا بەم حاڵەتە لە ناکاودا ڕوونادات، بەڵکو بە تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا دەبێتو، هەر ڕووداوێك لە ئوممەتدا ڕوو بدات خەڵکیش گۆڕانیان بەسەردا دێ، هەر لە مردنی پەیامبەرەوە - صلى الله عليه وسلم - کە یەکەم ڕووداوە دەروونییەکان ڕووبەڕووی ئوممەت بوونەوەو دەستیان پێکرد:**

**ئەنەس دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:** (لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي قَدِمَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ ، فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ ، أَوْ مَاتَ فِيهِ أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ ، قَالَ : وَإِنَا لَفِي دَفْنِهِ مَا رَفَعْنَا أَيْدِينَا عَنْ دَفْنِهِ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا) - ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - هاتە مەدینە تەواوی ئەوەی تیای بوو ڕووناك وڕۆشن بووەوە، کاتێك ئەو ڕۆژەش هات کە ڕۆحی کێشرا ویاخود مرد، تەواوی ئەوەی تیا بوو تاریك هەڵگەڕا، دەفەرموێ: لە ناشتنیدا بووین دەستمان لە ناشتنی هەڵنەگرت دڵی خۆمان نەدەناسییەوە.

**توربشتی دەفەرموێت:** (مەبەستی ئەوەیە کە ئەو سەفاو تەباییەیان لە دڵی خۆیاندا وەك جاران نەدەبینی، چونکە مادەی وەحییان لێ دابڕاو ئەوەی پەیامبەر - صلى الله عليه وسلم - پشتی پێ دەگرتن وفێری دەکردن نەما، ومەبەستی ئەوە نییە کە بڕوای پێشوویان لێ دابڕابێت).

**لێرەدا ئەو گۆڕانکارییەی کە بەسەر مرۆڤی موسوڵماندا هات سەرەتاکە بوو ..**

**گۆڕانەکەش بە وجودی هەست کردنەوە بەردەوام دەبێت، تا ئەو کاتەی موسوڵمان ئەو هەستەش لەدەست دەدات ..**

**بۆیە جاهیلیەت دەرفەت بە موسوڵمان نادات هەست بە کارەساتی ژیانی خۆی بکات دوور لە شەرعی خوای پەروەردگارداو، هەوڵ ئەدا غیرەتی بەرامبەر بە نامووس ودینی خۆی لەدەستدا بۆ ئەوەی هەستی بۆ نەمان و گومبوونی شەریعەتەکەی نەبزوێ ..**

**لێرەوە گێڕانەوەی ئەم هەست کردنە بە نەمانی شەریعەت یەکێکە لە گرنگترین ئەرك وپێویستییەکان ..**

**ئەرکی ڕووبەڕوو بوونەوەو هەوڵدانیش بۆ گەڕاندنەوەی شەریعەت بەرەو پێگەی دەسەڵات لە ژیانماندا هەر دەمێنێتەوە .. وە لە هەر بار وحاڵێکدا شتێك هەیە کە بتوانین پێی هەڵسین ..**

**ون بوونی شەریعەتیش لە واقیعی ژیانو، پاشان نەمانی هەست کردن بە ئاسەوارەکانی پەراوێزخستنی شەریعەتو، پاشان نەمانی باس کردنی شەریعەت لە دوای پەراوێزخستن ودوورکردنەوەی لە واقیع وهەستەوە .. پێویستی بە هەوڵ وتەلاشێکی زۆر مەزنە ..**

**بەلام ئێمە لە سەرەتا دەتوانین هەست کردنی سروشتیانە بە شەریعەت بپارێزینو، پشت بە سۆز وعاتیفەی موسوڵمانان بەرامبەر بە قورئانەوە بگرین بۆ ئەوەی تێکڕا**

**بچێتەوە ژێر چەتری هەست کردن بە پرسی حاکمیەتەوە، وبەستنەوەی حوکم کردن بە شەرع وبەرنامەی خوای پەروەردگار بە بەرژەوەندی وئاسایش وبەرەکەتی ژیان لە هەستی خەڵکدا ..**

**دەتوانین ئەو شەوق وپەرۆشییەی دڵی بەندەکانی بەرامبەر بە حاکمیەت داگرتووە بە زیندووکردنەوەی نموونە مێژووییەکانی دادگایی شەرعی شەحن کەینەوە، کە پڕی کتێبەکانی مێژوون ..**

"پیاوێك سکاڵای لای عومەری کوڕی خەتاب لە علی کوڕی ئەبو تاڵیب کرد، عەلی لە مەجلیسی عومەری کوڕی خەتاب دا بوو، عومەر ڕووی لە عەلی کرد وفەرمووی: هەستە أبو الحسن لەگەڵ بەرامبەرەکەت دانیشە -، عەلی هەستاو لەگەڵ بەرامبەرەکەی دانیشت وقسەو گفتوگۆیان کردو، دواتر پیاوەکە ڕۆیشت وعەلی گەڕایەوە مەجلیسەکەی ودانیشتەوە. عومەر هەستی کرد دەموچاوی تێکئالاوە پێی فەرموو: ئەی أبو الحسن چییە دەبینم گۆڕاویت، ئەوەی کە ڕوویدا پێت خۆش نەبوو ؟ فەرمووی: بەڵێ ئەی ئەمیری ئیمانداران، فەرمووی: بۆ ؟ فەرمووی: چونکە لە بەردەم نەیارەکەمدا بە کونیەوە (واتا باوکی فلان) بانگت کردم، نەدەبوو بتگوتبا: هەستە ئەی عەلی لەگەڵ نەیارەکەت دانیشە ! ئیتر عومەر سەری عەلی گرت ونێوچەوانی ماچ کرد .." [بغية الطلب في تاريخ حلب 127/2].

**دەتوانین ئەو هەستە بە ئەنجامدانی حوکمە شەرعییەکان زیندووکەینەوە لە دانیشتنی سوڵحکردن لە نێوان خەڵکدا، ولە بواری داوەری لە کێشە وململانێ کۆمەڵایەتی وخێزانییەکاندا، ولە قسەو گفتوگۆ لە نێوان موسوڵمانان بە زاراوەو دەربڕین وچەمکە ئیسلامییەکانەوە ..**

**هەموو ئەمانە ئەرکێکن هەر موسوڵمانێك لە هەر بارێکدا بێ دەتوانێ پێیان هەڵسێت، بەڵام بەو مەرجەی کە لە چوارچێوەی چارەسەری دەروونی ون بوونی شەریعەت بێت**

ونەبێتە جێگوزینی هەوڵ وتەلاش بە هەر هێز وتوانایەك بێت بۆ چەسپاندن وداوەری کردنی ئەم شەریعەتە.

بۆیە هیچ کاتێك نییە کاتی هەوڵ وکار کردن نەبێت .. تا ئەو کاتەی خوای پەروەردگار مۆڵەتی گەڕانەوەی شەریعەت دەدات .. ئەو شەریعەتە خۆشەویستە گومبووە ..



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٧